

ژوری ڕاپۆرتەکانی
ناوەندی کوردزاگ

سیاسی ستراتیجی

دەستەی کوردزاگ بۆ
هۆشیار کردنەوەی
نەتەوەیی کورد

# (ئۆپەڕاسیۆنی ماموت چۆن سەرچاوەی گرت)

ئامادەکردن: نەهرۆ ئەنوەر

بڵاوکراوە: ناوەندی کوردزاگ

2023-2024



# ئۆپەڕاسیۆنی ماموت چۆن سەرچاوەی گرت


نوسین و ئامادەکردنی: نەهرۆ ئەنوەر

ژوری ڕاپۆرتەکانی ناوەندی کوردزاگ-گۆشەی سیاسی و ستراتیجی


www.kurdzag.com

2023

# پێڕست



# تورکیاو ئەڵمانیای نازی

ئامانجی تورکیا پاراستنی بێلایەنی بوو لە جەنگی جیهانی دووەمدا، باڵیۆزی میحوەر و هاوپەیمانان لە ئەنقەرە تێکەڵ بوون، بەڵام عیسمەت ئینۆنۆ لە 18ی حوزەیرانی 1941 پەیمانی نادەستدرێژی لەگەڵ ئەڵمانیای نازی واژۆ کرد، ئەوەش 4 ڕۆژ پێش ئەوەی میحوەرەکان هێرش بکەنە سەر یەکێتی سۆڤیەت، گۆڤاری نیشتیمانی بۆزکورت و چینار ئاڵتو داوای ڕاگەیاندنی شەڕیان لەدژی یەکێتی سۆڤیەت و یۆنان کرد بە فیتی نازیەکان کە هانی تورکەکانیان دەدا بۆ ئەم جەنگە، لەساڵی ١٩٤٢ ئەڵمانیا کەوتبووە ناو بەرەیێکی فراوانی شەڕەوە بۆ ئەم مەبەستە چەندین هەوڵی دا تاوەکو دەستی بگا بە وزە بۆیە لە تەمموزی ساڵی ١٩٤٢ نازیەکان نەخشەی تورکیای گەورەیان بۆ دەزگای نهێنی تورکیا نارد داوایان لێدەکردن ئەو ناوچانە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان کە هی خۆیانە دواتر ئاڵوگۆڕی نەوت و گاز بکا لەگەڵ ئەڵمانیادا، کە قەفقاز و کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاستی لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت و کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا لەخۆگرتبوو هەروەها ویلایەتی موسڵ و سلێمانی و هەولێر و کەرکوکی لەخۆ گرتبوو، بەمەش تورکەکان کەوتنە خۆیان و بیریان لەڕێگە چارەیێکی دەکردەوە کە چۆن ئەم نەخشەیە جێبەجێ بکەن بۆیە لە هاوینی ١٩٤٢ فەرماندەیی باڵای تورکیا بیری لە شەڕ کردەوە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت نزیك بوو لەوەی ڕاستەوخۆ بچێتە ناو شەڕەوە بەم پلانانەی خودی هیتلەر داینابوون لەساڵی ١٩٤١ دابووی بە عەلی فواد ئەردنی بەڵام سودی نەبوو و هەر زوو کشانەوە.



# پلانی دەست بەسەردا گرتنی کوردستان بۆ تورکیاو وزەکەی بۆ ئەڵمانیا:

دواتر هەر لەساڵی ١٩٤٢ بیریان لە سوتەمەنی کوردستان کردەوە کە ئەویش لەناو نەخشەی گەورەی تورکیایە، بۆ ئەم مەبەستە دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیا خۆی ئامادەکرد لەو سەرو بەنەدەدا یەکێك بەناوی میولەر پەیدا دەبێ خۆی وەك شارەزا لەکاروباری کورد بە دەزگای هەواڵگری ئەڵمانی دەناسێنێت، میولەر خۆی ساڵی 1936 سەردانی کوردستانی کردبوو پێشتر شێخ مەحمودی ناسیبوو هەروەها لەگەڵ شیخ لەتیفدا سەردانی ناوچەی پشدەر و ڕانیەی کردبوو و ئاغاکانی ئەوناوەی دەناسی ئەمە وایلێکرد زیاتر هەواڵگری ئەڵمانیا باوەڕی پێ بکا، بۆیە میولەر بیری لە پلانێك کردەوە بەڵام دەبوایە لەم ئۆپراسیۆنە نهێنیەدا کوردێکیان لەگەڵدا بێت چونکە بێ کورد نەدەکرا بۆیە لەکەسێك دەگەڕان بەم مەبەستە دەزگای هەواڵگری تورکیایان ئاگادار کردەوە ئەوانیش لەکوردستان بەدوای هاوپەیمانەکانیان دەگەڕان کە بنەماڵەی ڕەشید ئاغایان هەڵبژارد بەهۆی ئەوەی نزیك بوون لە دەوڵەتی تورکیاو دژایەتی ئینگلیزەکانیشیان کردووە هەر کە بنەماڵەکەیان ئاگادار کردەوە ئەوانیش وتیان کوڕێکمان لەبەیروتە بەناوی ڕەمزی نافع ڕەشید ئاغا بەم مەبستە دەزگای هەواڵگری تورکیا لەبەیروت دۆزیانەوەو داوایان لێکرد بێتە ئەنقەرە ڕەمزیش لە ساڵی ١٩٤٢ چووە ئەنقەرە لەوێ ناسنامەی سەربازی تورکیان بۆ دەرهێناو مۆڵەتی هەڵگرتنی چەکی پێ بەخشرا ڕاهێنانیان پێکرد دواتر هەواڵگری تورکیا ناردیان بۆ لای یەکە هەواڵگیریەکانی ئەڵمانیاو پلانەکەیان پێ ووت بەم مەبەستەش لەگەڵ هەواڵگریەکان چوو بۆ ئەڵمانیاو بینینی میولەر، بەڵام میولەر دەکەوێتە ناو هەڵەوەو پێی دەڵێ وەعدی دەوڵەتی کوردیمان لە هیتلەر وەرگرتووە بەڵام هەر لەکتێبەکەی بە چاپی ئەڵمانی دەڵێ بۆ ئەوەی سیخوڕە کوردەکەی تورکیا (ڕەمزی نافع) ڕازی بێ وام ووتوە ئەم کوڕە زۆر گەمژەیەو شکستی بە ئێمە هێنا.



# میولەر و ئۆپەڕاسیۆنەکە

میولەر "ساڵێك دوای هاتنەوەی کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناونیشانی "خۆکوتانە ناو کوردستانی داخراو" کتێبەکە کراوە بەکوردی لەدەزگای ژین لەسلێمانی چاپکراوە.
ئۆپەڕاسیۆنەکە لە چوار کەس پێکهات بوو میولەر، و جۆرج کۆنیچنی و هۆفمان ناوێك دەبن کە تەنها لەبەر فارسی زانین بەشداری دەکەن هەروەها ڕەمزی نافعی سیخوڕی تورکیاش بەڵام ئۆپەڕاسیۆنەکە سەری نەگرت و ئەنجامەکانی دیار بوو لەبەرچی سەری نەگرت بۆ ئەم مەبەستە ئۆپەڕاسیۆنی ماموت بخوێننەوە کە زانیاری وردی تێدایە لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەچونی ئۆپەڕاسیۆنەکە، دوای ئەوەی شکستیان خوارد ئینگلیزەکان جۆرج و کۆنیچنی و هۆفمان و ڕەمزی دەستگیر دەکەن و میولەریش ڕزگاری دەبێ دواتر ئەڵمانیا داوا دەکا هۆفمان و کۆنیچنیش ئازاد بکرێن بۆیە ئەوانیش ئازاد دەکرێن بەڵام ڕەمزی دەمێنێتەوە بنەماڵەکەی بەتورکەکان دەڵێن ڕزگاری بکەن بەڵام جوابیان نادەنەوە، میولەر لەکتێبەکەی چاپی ئەڵمانی دەڵێ دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیا هیچ هەوڵێکی بۆ سیخوڕەکەی تورکیا نەدا چونکە شکستی بە پلانەکەمان هێنا لەبەر نەزانینی.



# دەرئەنجامەکان

1ـ تورکەکان هەمیشە ڕۆڵێکی ناجێگیریان بینیوە هەر جارەو لای زلهێزێکیان گرتوە.
2ـ ئەڵمانیای نازی و دەوڵەتی تورکیا لەسەردەمی عیسمەت ئینۆنۆ پەیوەندی هەواڵگری وردیان هەبووە.
3ـ ئەڵمانیای نازی هەوڵیداوە بۆ بەدەستخستنی وزە لە قەوقاز و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستانیش بەتایبەتی.
4ـ نازیەکان لەخەمی بیری ناسیۆنال سۆسیالیزمی دانەبوون کە بڵاوی بکەنەوە لە تورکیا یان کوردستان بەوشێوەیەی کە هەندێك بەناو نوسەر و لایەنەکان باسی دەکەن ئەمە لەنەزانینی کوردە.
5ـ میولەر زیاتر بۆ خۆ دەرخستن لەناو هەواڵگری ئەڵمانیا هەستاوە بەم کارە.
6ـ بنەماڵەی ڕەمزی نافع سوخرەکێشی تورکەکان بوون ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە دەست تێوەردانی تورکیا لەهەرێمی کوردستانی ئێستا نوێ نیە بەڵکو هەمیشە چاوی بڕیوەتە کوردستان لەلایەن حوکمەتە جیا جیاکانیەوە.
7ـ ئەڵمانەکان لەگەڵ تورکەکان ڕێکەوتبوون کە کوردستان بخەنەوە سەر تورکیا.
8ـ ڕەمزی نافع سیخوڕێکی تورك بووەو بەکاریان هێناوە، بەزۆرکردنە پاڵەوان و ڕزگارکەر و یان بیرو فکرەی ناسیۆنال سۆسیالیزمی هەبێ شتێکی درۆینەیە و زیاتر ئەو لایەنەیە نزیکە لەتورکیا ئەم ئاگرە خۆش دەکات.
9ـ ئەڵمانەکان و تورکەکانیش باکیان بە ڕەمزی نافعی سیخوڕ نەبووە کاتێك گیراوە هەر بیریان لێ نەکردۆتەوەو بەلاشی دا نەچوون تاوەکو شێت بووە.



# کۆتایی

پەند وەرگرتن لەم ڕووداوە ئەوەیە:

دەبێ ڕۆڵەکانی کورد پەند وەربگرن کە هەرگیز نەبنە دارەدەستەی دوژمن چونکە دوژمن تا ئەوکاتە بەکارمان دەهێنێ کە ئیشیان پێمانە دواتر پولێکمان پێوە دەنێن و ناشمان ناسن.



# لیستی سەرچاوەو بەڵگانامەکان


سەرچاوە:

1-

Das Unternehmen "Mammut". Ein politisch-militärisches Geheimdienstunternehmen in Südkurdistan in den Jahren 1942/43 und seine Vorgeschichte.

2-

Unternehmen Mammut,Axis History Forum.
https://forum.axishistory.com › vie...
Unternehmen Mammut.

3-

https://www.cia.gov/readingroom/documen ... 098d515871.

4-

1945 Tarihli BOZKURT Gazetesi.

5-

مهمة المانية خطيرة في كوردستان العراق عام
١٩٤٣: عملية ماموت, دكتور شيرزاد احمد النجار.

6-

Müller, Gottfried Johannes, In the Burning Orient, 3rd ed., Salem-Buchdienst GmbH, Stadtsteinach, 2007



# بەڵگانامەکان



مۆڵەتی چەك هەڵگرتنی ڕەمزی نافع ڕەشید ئاغا لە دەوڵەتی تورکیا




ناسنامەی سەربازی ڕەمزی نافع



هیتلەر و جەنەڕاڵەکەی تورکیا ١٩٤١




ڕۆژنامەی تانی تورکی ساڵی 1943 دەربارەی ڕەمزی






ڕۆژنامەی تان بە ئینگلیزی نوسراوە سیخوڕەکەی تورکیا ڕەمزی نافیع




ڕۆژنامەی بۆزکورت ونەخشەی گەورەی تورکیا ئامادەی پێکردووە لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە درووست کراوە 1941




نەخشەی کێشراو لەلایەن نازیەکانەوە بۆ تورکەکان

1941